# ئافرەتان

# کاتێك دەکەونە سوڕی مانگانە (یان زەیستانی)

# چۆن کردەوەی چاك ئەنجام بدەن؟

✍نوسینی: محمد بن سليمان بن عبدالله المهنا

✍ وەرگێڕانی: هشام لطيف بەرزنجی



**پێویستە لەسەر ئافرەتی باوەڕدار ڕازی بێت بەوەی پەروەردگار بڕیاریداوە لەسەری.**

لە (بوخاری و موسلیم)دا هاتووە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ چووە ژوورەوە بۆلای عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگریا "چونکە کەتبووە سوڕی مانگانەوە (حەیز) لە کاتی حەج" دڵی دایەوە و فەرمووی: «ئەمە بڕیارێکە و خوای گەورە بڕیاریداوە لەسەر کچەکانی نەوەی ئادەم» پاشان پێی فەرموو: چی بکات و چی نەکات لەکاتی حەجەکەیدا.



**لەو موژدانەی کە باوەڕداری پیا و ئافرەت دڵخۆش دەکات ئەوەیە:**

**ئەگەر کەسێك لەسەر کردەوەیەکی چاك بەردەوام بووبێت پاشان وازی لێبێنێت بەهۆی عوزرێکی شەرعییەوە (نەخۆشی یان سەفەر یان هەر عوزرێکی تر) ئەوا خوای گەورە پاداشتی بۆ دەنوسێت ئەگەر نەتوانێت ئەو کردەوە چاکە بکات، ئەمەش فەزڵی خوای گەورەیە.**

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: " إِذَا مَرِضَ الْعَبْدُ أَوْ سَافَرَ، كُتِبَ لَهُ مِثْلُ مَا كَانَ يَعْمَلُ مُقِيمًا صَحِيحًا ". البخاري: (٢٩٩٦).

واتە: کاتێك کەسێك نەخۆش دەکەوێت یان سەفەر دەکات، ئەو پاداشتەی بۆ دەنوسرێت بۆ ئەو کردەوە باشەی ئەنجامی دەدا کە لە شوێنی خۆی بووەو لەشساغ بووە.

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجَعَ مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَدَنَا مِنَ الْمَدِينَةِ، فَقَالَ : " إِنَّ بِالْمَدِينَةِ أَقْوَامًا مَا سِرْتُمْ مَسِيرًا، وَلَا قَطَعْتُمْ وَادِيًا إِلَّا كَانُوا مَعَكُمْ ". قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ ؟ قَالَ : " وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ حَبَسَهُمُ الْعُذْرُ ". البخاري: (٤٤٢٣).

واته: له ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە لە جەنگی تەبوك، نزیك بووەوە لە مەدینە فەرمووی: «لە مەدینە کەسانێکی تێدایە ئێوە هیچ هەنگاوێکتان نەناوە، وە هیچ دۆڵێکتان نەبڕیوە، ئیللا ئەوان لەگەڵ ئێوە بوونە (لە پاداشت)» فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوان لە مەدینە بوونە؟ فەرمووی: « ئەوان لە مەدینە بوون، بەڵام عوزر ڕێگرییانی لێکرد (چونکە ئەوان نییەتیان هەبوو بچن بۆ جەنگ، بەڵام نەخۆشی بووە ڕێگریان)».

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِيمَا يَرْوِي عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ : " إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ، ثُمَّ بَيَّنَ ذَلِكَ، فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً " البخاري: (٦٤٩١) ومسلم: (١٣١).

واته: لە ئیبن عەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە لە پەروەردگاری فەرموویەتی (فەرموودەکە قودسی یە): «خوای گەورە فەرمانی کردووە (بە فریشتەکان) بە نوسینی چاکەو خراپە، پاشان ڕونی کردووەتەوە (بۆ ئەو دوو فریشتەیە چۆن بینووسن)، هەرکەسێك هات بە دەڵیدا چاکەیەك بکاتو نەیکرد (بەهۆی عوزرێکەوە) ئەوا چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنوسرێت».

ئەوە خوای گەورەیە دەوڵەمەندەو چاکەی زۆرە بەسەر بەندەکانی یەوە.



## بە یەکدەنگی زانایان دروستە بۆ ئافرەت کە دوعا و زیکر بکات لە کاتی سوڕی مانگانە (وە زەیستانی).

بۆیە پێویستە لەسەر ئافرەتی باوەڕدار کاتەکانی بە زیکر و دوعا بەرێتە سەر، بە هەموو جۆرەکانی زیکر وەکو: سبحان الله و لا إله إلا الله و الله أكبر و

الحمد لله و صلاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

وە ئەو کتێبانەش بخوێنێتەوە کە زیکری تێدایە وەکو حصن المسم و کتێبی دوعا لە قورئانو سوننەت (نوسینی: سعید بن علي بن وهف القحطاني –ڕەحمەتی خوای لێبێت–) ئەوا کارێکی باشە.



## دروستە بۆ ئافرەتێك لە سوڕی مانگانەدا بێت (بەهەمان شێوە زەیستانی) قورئان بخوێنێت.

ئەمەش مەزهەبی ئیمام مالیكو ڕیوایەتێکیشە لە ئیمام ئەحمەد (وتەیەکیشە لە ئیمام شافعی)و کۆمەڵێکی تر لە زانایان ئەم بۆ چوونەیان هەڵبژاردووە لەوانە شێخول ئیسلام ئیبن تەیمیە (ڕەحمەتی خوایان لێبێت).

شێخول ئیسلام ئیبن تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) فەرموویەتی: لە قورئانو سوننەت هیچ ڕێگرییەك نەهاتووە کە ئافرەت قورئان بخوێنێت.

ئافرەتان لە سەردەمی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەکەوتنە سوڕی مانگانەوە ئەگەر بێتو قورئان خوێندن حەرام بوایە لەسەریان وەکو نوێژکردن ئەوا پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ڕونی دەکردەوە بۆ ئوممەتەکەیو دایکی باوەڕدارانیش دەیانزانی، وە خەڵکی دەیان گێڕایەوەو باسیان دەکرد، کە کەس لە پێغەمبەری خوای صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەیگێڕاوەتەوە.

ئەوا بۆ ئێمەش دروست نییە حەرامی بکەین، لە کاتێکدا ڕێگری لێ نەکراوە، کەواتە حەرام نییە.(١)

کە ئەمە وتەی تەواوە: دروستە ئافرەتێك لە سوڕی مانگانە (یان

(١) مجموع الفتاوي (١٩١/٢٦).

زەیستانی) بێت قورئان بخوێنێت، کە ئەمەش وتەی هەندێك لە زانایانی هاوچەرخە لەوانە شێخ ئیبن باز (ڕەحمەتی خوای لێبێت).

وە ئەوەی پێویستە ئاگاداربین:

دەست لێدان لە قورئان دروست نییە جگە لە کەسانێك لە پاکییەتیدا بن، بۆیە ئافرەتێك لە سوڕی مانگانە (یان زەیستانی) بێت ئەوا پێویستە لەسەری دەستکێش یان بە قەڵەم یان هاوشێوەی ئەوانە پەڕەی قورئانەکە هەڵبداتەوە یان لەسەر مۆبایل (یان ئایپاد یان کۆمپیوتەر) یان لەسەر قورئانێك کە تەفسیری تێدابێت ئەوا دروستە دەستی لێبداتو بیخوێنێتەوە.(٢)



لەو کردارە باشانەی تر ئەنجامی بدات خوێندنەوەی کتێبی بەسوودە:

زانست و زانیاری شەرعی پێ زیاد دەکاتو ئیمانی زیاد دەکاتو لە خوای گەورە پێی نزیك دەبێتەوە، بەتایبەتی سونەنەکان (سنن الترمذي و أبو داود و...)، وە لە هەموو فەزڵی زیاتر بێتو چاکترو گەورە تربێتو سوودی زیاتر بێت صەحیحی بوخاری و موسلیم وە ریاض الصالحين دانراوی ئیمامی مەنەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێبێت)

وە جگە لەوانەش سوپاس بۆ خوا زۆرە.



لەو کردەوە باشانەی تر کە ئەنجامی بدەن.

لە دەشەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان تەنها پێك نەهاتووە لە زیکر و قورئان خوێندن، بەڵکو زیاترە:

لەوانە: خێرکردنو گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتیو سەردانی نەخۆشو

---

(٢) هیچ بەڵگەیەکی (صحیح و صَریح‌و بەڕاشکاوی) نەهاتووە کە ئافرەت لە سوڕی مانگانە یان زەیستانی بێت نەتوانێت دەست بدات لە قورئان. –وەرگێڕ–

خزمەتکردنی ئەوانەی بەڕۆژوون لە پێناو خوای گەورەو چاوەڕوانی پاداشت بێت لای خوای گەورە،

ئەمانە دەبێتە هۆی زیادبوونی باوەڕیو نزیکبوونەوە لە خوای گەورە.



لە باشترین ئەو کردەوانەی لە دەشەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان ئەنجامی بدات خزمەت کردنی ئەو کەسانەیە کە بەڕۆژوونو ئیعتیکافیان کردووە، ئەگەر ئاسان بوو بۆی، ئەگەر بە ناردنی خواردن بێت یان شۆردنی جلو بەرگ ... کە ئەمە خێر و چاکەیە.